گەلی فەلەستین خاوەنی پشتێکی گەورەو ئەستوورە گەرچی بەجدی دەرنەکەوتووەو گەلی باسك رۆشنبیری لەدراوسێی ئەورووپیەکانی فێردەبێ.

لەبەشی سێیەمی پەرتوکەکەم ئاماژەم بەبنەچەی بنەماڵەی بارزانی کردووە کەعەرەبن‌و خواش دەزانێ لەچ جێگایەکی دورگەی عەرەبیەوە هاتوە. ئەمەش زانیارییەکە هەتا بارزانیش نەیدەزانی..! ئەویش بوو بەشداریکرد لەگەڵ درندە سەدام حسێن‌و محەمەد رەزاشا بەفەرمانی C I A بۆ شکستهێنانی شۆڕشی کورد لەساڵی ١٩٧٥ کەئەمەش خیانەتێکی گەورەبوو, دوابەدوای ئەویش بەڕێز مەسعود بارزانی خیانەتێکی گەورەتر لەوەی باوکی ئەنجامدا کە لە ١٩٩٦/٨/٣١ چاوساغی سوپای عێراقی کرد بۆ سەرخاکی کوردستانی ئازادو تەنها من‌و چەند کەسانێك نین ئەو مێژووە لەبەربکەن‌و بینووسن بەڵکو راستییەکان دەدوێن‌و مێژووش دەنووسێ.

هەڵوێستی مامۆستای بەئەمەكو بەڕێز ئەحمەد حەمروش‌و هاوەڵەکانی ناکێشرێ بەئاڵتون کەکۆشش دەکەن بۆچارەسەرکردنی کێشەی کوردو قەرزاری کەسیش نین لەوانەی هەڵوێستیان نیە.

بەڵام هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ (وذكر ان نفعت الذكرى), تکام لەخوای گەورەیە روناکی بخاتە دڵتانەوەو بەچاوی خۆشەویستی‌و سۆزەوە سەیری ئەم گەلە بکەن‌وسەیری ئەم گەلە بکەن کاربکەن بۆ ئەوەی دەستتان هەبێ لەرزگارکردنی ئەم گەلە(من يعمل مثقال ذرة خيرا يره).

هاوپێچ, نامەیەك بۆ بەڕێز کولن پاول‌و نامەیەك بۆ بەڕێز تۆنی بلێرو نامەیەك بۆ سەرۆکانی
ولاتانی بازاڕی ئەورووپی هاوبەش نامەیەکی زمانی ئینگلیزی کورتکراوە بۆ هەرسێ بەشی کتێبەکەم, خوا هیدایەتم بداتو تەنها خواش خۆی بەتوانایە.

لەکۆتاییشدا داوای لێبوردن دەکەم گەر بێت‌و سنورم بەزاندبێ لەنووسینەکەمدا, بەڵام
(اللهم انی بلغت, اللهم فأشهد)، ئەمەو سڵاوم بۆ سەرجەم برایانی عەرەب لەهەر کوێ هەن, ئەوانەی داکۆکی لەمافەکانی کورد دەکەن لەژێر سێبەری نەتەوەی عەرەب (سوریاو عێراق) بەتایبەتی سەرۆك معمر قەزافی.

لەکۆتاییدا لەگەڵ سڵاو خۆشەویستیم

**خزمەتکاری کوردو هاوڕێی عەرەب**
**رەفیق پشدەری**
**سلێمانی-عێراق**

فاکسی مەکتەب دیلان (٠٠٤٤٢٠٧٧١٣٨٨١٢)

## نامەی نۆهەم
## نهێنی و زۆر تایبەت

### بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

**بەڕێز سەدام حسەین/ سەرۆکی دەوڵەتی عێراق**

دوای ڕێزو سڵاو

ئەمە ئامۆژگارینامەیە نەك هەڕەشەنامە" بیرخەرەوەیە نەك تەمبێ, کەخزمەتکاری گەلی کوردو کوردستان، رەفیق پشدەری بۆ سەرۆکی دەوڵەتێکی دەنێرێ راست وایە بگوترێ گەندەڵی ئیداری لێکیهەڵوەشاندو لەرووخاندایە, تەنها خواش چارەنووسی ئەم گەلە داماوە دەزانێ.

سەرۆکی رێزدار: بڕواناکەم لەبیرت چووبێتەوە کەتا مێژوویەکی نزیك متمانەی نێوان منو تۆ سەد دەر سەدبوو, تەنانەت جارێکیان دوای مشتومڕێکمان تۆ فەرمووت: (منو تۆ لێکتر دەچین, من لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەند نیم کەچی توانیم بەخۆم, خۆم پێبگەیەنم, جەنابیشت هەروەها... هەردەڵێی لەباوكو دایکێك بووین). ئینجا لەشوێنی خۆت هەڵسایتو ئەملاوئەولامت ماچکرد... بەڵام ماشەڵا چەرخی گەردوون چۆن دەسووڕێ! زەمانە تێپەڕیو برایەتیمان وەرگەڕایە دوژمنایەتی, ئەوەبوو دووجار هەوڵمدا بتکوژم بەڵام دەستم تێت نەچوو. دوای ئەوە جەلادەکانت بەدڕندانەترین شێوە ئەشکەنجەیاندام هەتا هەستمکرد مەرگ دەستی لەملم ناوە بەڵام لەدواساتدا تۆ فەرمانتدا ئەشکەنجەدانم راگرنو برینەکانم چارەسەربکەن, پاشان کاتێك سەرۆکایەتیی دەوڵەتت گرتەدەست فەرمانی لەسێدارەدانمت هەڵوەشاندەوەو لەزیندان ئازادت کردم هەرچەندە یەکێك لەو تۆمەتانەی پێی تاوانبارکرابووم سیخوڕیکردن بوو بۆ ئیسرائیلو ئێران... من لەلای خۆمەوە شوکرانەبژێری خودای گەورەم کەدەستمی بەخوێنت سورنەکردو رێگەی لەتۆش گرت کەبمکوژی, کەئەمە تەنها بۆ ئەوە بوو بۆ ئەم رۆژەم بێڵێتەوە تائەم نامەیەت بۆ بنووسم بەشکو ببێتە مایەی خێروخۆشی بۆ گەلی عێراق بەگشتیو گەلی کورد بەتایبەتی... کەسیش نازانێ رۆژگار چی بۆمان ناوەتەوە, بەڵام: (اللهم انی بلغت, اللهم فأشهد) ...

بەرێز سەرۆك

دەمەوێ بەکورتی ئەو رووداونەی بەسەر کوردستانی باشوردا هاتوون بخەمە خزمەتت" لەدامەزرانی حکومەتی مەلیك مەحمودەوە هەرچەندە بەزۆری پێم وایە کەبەڕێزتان ئاگاداری بەسەرهاتەکانی کوردستانن, بەڵام سەرباریشی دەمەوێ هەندێ مەسەلەتان بیر بخەمەوە ...

رووداوەکانم بەسەر نۆ بەشدا قۆناغبەندی کردوە کەئەمانەن:

١– حکومەتی بەریتانیا پلانی بۆ رووخاندنی حکومەتی مەلیك مەحمود دارشتو رووخاندی, دوای ئەوەی دەستگیریشی کرد بۆ دەرەوەی وڵاتی دوورخستەوەو پاشان کوردستانی باشوری بەزۆر خستەسەر دەوڵەتی عێراق.

٢– گەلی کورد ٣٦ ساڵ ژێردەستەی دەسەڵاتی پاشایی بوو, هەرچەندە کێشەکەمان لەکارنامەی دیپلۆماسیدا نەبوو بەڵام ئەو دەسەڵاتە مافی هاوڵاتی عەرەبی عێراقی پێبەخشینو لەئەنجامدا دەرگاکانمان لەرووداکرانەوە, بۆ نمونە کورد چەندین

جار پۆستی سەرۆك وەزیران, وەزیری بەرگری, وەزیری ناوخۆو سوپاسالاری عێراقی گرتەدەستو, لەكۆی ١٤ پارێزگاكەی ئەو سەردەمە ١١ پارێزگاریان كوردبوون. لەسەردەمی پاشایەتیدا" پارێزگارو سەرۆكی دادگاو بەڕێوەبەری پۆلیسو بەڕێوەبەری شارەوانیو بەڕێوەبەری فەرمانگەی سەربازگیری لەكەركوك كوردبوون،٩٥٪ی هێزی پۆلیسو ٧٥٪ی هێزی سەربازی فیرقەی دوو ٨٥٪ی دانیشتوانی پارێزگاكە كوردبوونو ١٥٪ەكەیتر توركمان بوون. گۆڕستانی كەركوك دیارترین شایەدە كەتا ئەو كاتە یەك مردووی عەرەب لەوێ نەنێژراوە.

٣- دوای راگەیاندنی پرنسیپی (كوردو عەرەب لەم نیشتمانەدا بەشدارن) لەلایەن سەركردەی كۆچكردوو عەبدولكەریم قاسمەوە لەسەروبەندی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨دا, باری كورد باشتربوو چونكە رێگەی پێدرا حزبایەتی بكات, ئەوەبوو پارتی دیموكراتی كوردستان بەسەرۆكایەتیی مەلامستەفای بارزان راگەیەنرا ئینجا رۆژنامەیەكو دوو گۆڤاری كوردی دەركرا. گەلی كورد چاوەڕێی كاری باشتری لەسەرۆك قاسم دەكرد بەلام مەلامستەفا بەهۆی خۆسەپاندنی بەسەر پارتیدا بەپاڵپشتی مەكتەبی سیاسی, هەموو ئاواتەكانی لەگۆڕنا.

٤- كودەتای ساڵی ١٩٦٣ بەعسییەكانی بەشەمەندەفەری ئەمریكی كردە دەسەڵاتدار, ئینجا بەیاننامەی ژمارە ١٣یان دەركرد كە بەبێ سڵكردنەوە رێگەی بەكوشتنی كۆمۆنیستەكان دەدا, هەریەكە لەبەڕێزان عەبدولسەلام عارفو ئەحمەد حەسەن ئەلبەكرو سەدام حسەین لەچۆنیەتی لەناوبردنی نەتەوەی كورددا هاودەنگ بوون, بەڵام رێڕەوی سەرۆك عەبدولڕەحمان عارف جیاوازبوو كەهەوڵیداو بەكردەوە تێكۆشا كەكێشەی كوردی بەیەكجاری چارەسەربكات، بەڵام جەنەراڵەكانی سوپای عێراق بەسەركردایەتیی تاوانبار عەبدولڕەزاق نایف بەرگیری جێبەجێكردنی ئەو هەنگاوەیان لێكرد.

ئێوە بۆ پاكتاوكردنی گەلی كوردو لەناوبردنی رەگەزەكەمان دەستتان نەپاراست, ئێوە تەعریب, تەبعیس, ئەنفال, زیندەبەچاڵكردن, بەناپاڵمو كیمیایی بۆمببارانكردن, لەسێدارەدان و لەناوبردنی ١٨٢ هەزار كوردتان جێبەجێكرد, رێبازەكان یەكبوون ئامانجیش هەر یەك بوو, بەڵام وریابە: رۆژان رۆژی بەدوودا دێتو ستەمكار هەر گیرۆدە دەبێت.

٥- دوای ئەوەی سوپای عێراق, كوێتی داگیركرد ئەمریكا سەركردایەتیی سوپایەكی ئەوروپی كردو جەنگێكی وێرانكەری دژی عێراق بەرپاكرد كەهاوسەنگییەكانی تێكداو لەئەنجامدا لەكوردستان راپەڕین كراو ئەو بارە هاتەدی كەكورد لە٨٠ ساڵەوە چاوەڕێی دەكرد, ئەوەبوو سوپای عێراق لەماوەی چەند هەفتەیەكدا وەك تەمی بەر خۆر هەڵبرینگاو دەنگوباسی كوردستان بوو بەوێردی سەرزاری هەموو جیهان.

٦- كۆچڕەوی ٣ ملیۆن كورد بەرەو سنورەكانی ئێرانو توركیا كاریگەری خۆی نواندو كەناڵەكانی دەنگوباس بڵاویانكردەوە, جیهان شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو, هەڵاتنی كۆمەڵانی خەڵكی كوردستان لەترسی زۆرداریی بەعس وایكرد كەهێڵی پانی ٣٦ دیاریبكرێتو چەند هێزێكی هاوپەیمانان لەبنكەی ئەنچەرلیكی توركیا جێگیربن. ئەم هەلومەرجە ئەمنییە بوو بەمایەی راگەیاندنی هەڵبژاردنو دامەزراندنی پەرلەمانی كوردیو دواجار پێكهێنانی حكومەتی كوردی.

٧- پاوانكردنی دەسەڵات لەلایەن حزبە كوردییەكانو دەستگرتن بەسەر داهاتەكانی خاڵی ئیبراهیم خەلیل وایكرد پارەوپوڵی زۆر كۆبێتەوەو ئەمەش لەئەنجامدا بوو بەمایەی لەبیرچوونەوەی كێشەی كوردو چارەنووسی گەلی كورد, ئەوەبوو ئاگری ئاژاوە هەڵگیرساو شەڕی ناوخۆ لەنێوان حزبە كوردییەكاندا بەرپابوو.

٨- لە٣١ی ئابی ١٩٩٦دا نەگبەتییە گەورەكە روویداو پەردە لەرووی دوژمنی راستەقینەی كورد هەڵماڵرا ئەویش كاتێك مەسعود بارزانی كردەوەیەكی ئەنجامدا هیچ خائینێك جگە لەئەو" پركێشی نەكردوە بیكات, ئەوەش هێنانی سوپای عێراق بوو بەفەرماندەیی (قصی) بۆ داگیركردنی كوردستانی ئازاد.

گەورەم ئەی سەرۆك: رووداوەکانی ئەم ساڵانەی دواییو گۆڕانکاریی ناوچەکە کاریکیانکرد هاوڵاتی کورد بیرێکی دروستی لەلا گەڵاڵە بێتو بیروباوەڕە چەوتەکانی راستبکاتەوە. جا ئەگەر ئەم کتێبەم" ١٥ ساڵ لەمەوبەر بڵاوبکردایەوە خەڵکی بەر هێلکەو تەماتەیان دەدام.

هەرچەندە سەر بەهیچ حزبو لایەنێك نیم و دان بەهیچ دەسەڵاتێکدا نانێم هەروەها پشت بەعەشیرەت یا ماڵو سامانێك نابەستم, بەڵام توانیم کتێبی (کورد دوژمنی خۆت بناسە) بەسێ بەرگ دەربکەم. دیارە هۆی ئەوەی کەخەڵکی بەپەرۆشەوە روویان لەکتێبەکەم کردو بەنهێنی بڵاوبوونەوەی لەهەموو لایەکداو لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانیداو, بەئاشکرا لەسایەی دەسەڵاتی یەکێتیی نیشتمانیو لەچاپدانەوەی لەئەوروپاو میسرو گەیشتنی کتێبەکەم بەدەستی هەموو کەسێك لەوانەی پەرۆشی زانینی راستیەکانن نیشانەی سێ شتە, یەکەم: رەزامەندی خودا, هەروەکو پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی (اعظم الجهاد کلمة حق عند سلطان جائر), دووەم: چەندیەتیی وشیاربوونەوەی خەڵکی جگەلەوەی گەل بەهێزترین پاڵپشتە مرۆڤ پشتی پێ ببەستێت. بۆ ئاگاداری بەڕێزیشتان تێچوی لەچاپدانی کتێبەکەمو بژێوی خۆمو خێزانم لەسەر پیاوچاکانی نانبدەو نیشتمانپەروەرە, سێیەم: یەکێتیی نیشتمانیی کەهەڵوێستی وای هەیە هەندێك کەس قێزیان لێدێتەوە بەڵام ئازادی چاپەمەنیو دەربڕینی بیروڕا بەشێوەیەك ناوچەی دەسەڵاتەکەی
گرتۆتەوە مەگەر تەنها وڵاتانی ئەسکەندناڤیا ئازادی وایان بەخۆیانەوە بینیوە.

دوای ٨٠ ساڵ لەکۆیلایەتی, راپەڕین کراو گەل ئازادی بەدەستهێنا هەرچەندە ئەو ئازادییە ئەوە نەبوو کەخەڵك ئاواتی بۆ خواستبوو بەڵام گەل ئەوەی بەلاوە پەسەندترە لەسایەی بنەماڵەی بارزانیدا بژی" بەهەموو ستەمکارییو هەڵوێستێکی نابەجێیان کەدژی پێکهێنانی دەسەڵاتێکی کوردییە, نەك لەسایەی بەعسدا بژی کەزیندەبەچاڵ بکرێتو لەناوببرێت. مەبەستم ئەوەیە لەوانەیە پیاوەکانت بیری گەڕانەوە بۆ کوردستانو سەرلەنوێ داگیرکردنەوەیت بەگوێدا بدەن. بەڵام وریابە, بڕوات بێت تەنانەت خاکو خۆڵی کوردستانیش تۆی ناوێت, بەرواڵەت فریو نەخۆیت. ئێستا ١١ ساڵ بەسەر راپەڕیندا تێپەڕیوە, نەوەیەکی نوێ پێگەیشتووە کەئەوەندەی قسەوباسی دەربارەی زەبروزەنگو زۆرداریی سایەی بەعس بیستووە کە بەلای بیرکردنەوە لەرازیبوون بەزاڵدەستیی بەعسدا ناچێت, چونکە ساڵانێکی زۆر: کردەی ئێمەو بردەی ئێوەبوو.

گەورەم سەرۆك: لەوانەیە لەهۆی نووسینی ئەم نامەیەم لەدوای ئەو هەموو ساڵەو لەم بارودۆخەدا بپرسیت.. جا ماوەیەکە رادیۆو کەناڵەکانی سەتەلایت, هەواڵی سەرکۆماری پێشووی یۆگسلاڤیا — سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ بڵاودەکەنەوە کەئێستا لەزینداندایە لەلایەن دادگای تاوانەکانی جەنگ لەلاهای, لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرێت.

سیاسەتمەداران جەختدەکەن لەسەر تیاچوونت, بەڕێزیشتان چاك دەزانن کەدوژمنانت لەساڵی ١٩٩١ـەوە بۆت لەبۆسەدانو پلان بۆ دەستگیرکردنت دادەڕێژن. بەم بۆنەیەوە من ئەم شایەدییە دەدەم کەجارێکیان لەگەشتێکدا بۆ وڵاتانی کەنداو, ئاگادارم کردیت کەنەچیت, چونکە پلانێك بۆ دەستگیرکردنت لەکاتی گەشتەکەدا دانراوە, لەوەڵامدا گوتت: (کاك رەفیق, من ئەوەندە نەوێر نیم کەبەو ئاسانییە خۆم بەدەستەوە بدەم). ئینجا چەکێکی ئەوەندەی قوتوولکەیەك لەگیرفانی پانتۆڵەکەت دەرهێناو فیشەکێکی گەورەت لێدەرکردو گوتت: (پێش ئەوەی بهێڵم بەئاواتیان بگەن, ئابەم فیشەکە خۆم دەکوژم).

دەزانم بەڕێزت ئەوەندە نەوێرو بوودەڵە نیت, بەڵام بڕواش ناکەم ئەمجارە بەخۆکوشتن رزگارت بێت, چونکە دوژمنەکەت زۆرزانترەو بارودۆخیش گۆڕاوە.. تەواو لەو باوەڕەشدام کەرۆژێك دادێت, دەبیستین سەرۆك سەدام حسینی سەرکۆماری

عێراق, دەستگیرکراوەو دراوە بەدادگای تاوانەکانی جەنگ. خۆ لەوانەیە بەڕێز سلۆبۆدان بتوانێت داکۆکی لەخۆی بکات یان خەڵکێك بۆ پشتگیرکردنی, خۆپیشاندان ساز بکەن, بەڵام تۆ بەهۆی تاوانەکانت بۆ لەناوبردنی گەلی کورد کە لەساڵی ١٩٦٣وە جێبەجێیان دەکەیت, هیچ بەهانەیەك فریات ناکەوێتو بڕواش ناکەم گوێت لەدەنگی یەکێك بێت لەشەقامەکاندا پشتگیریت بکات.

هەفتەیەکە سەر دێنمو سەر دەبەم هەتا ئەم پرسیارە بەمێشکمداهات: ئێمە, بەپێی ئەزموونی چەند ساڵەمان لەگەڵ سەرۆکە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق, بڕوا ناکەین فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر لەعێراقدا ببینین, خۆ ئەگەر بارودۆخیش ئەمەی رەخساندو خوا سەرکردەیەکی دادپەروەری بۆمان نارد ئەوە دوژمنایەتیی رەگداکوتاوی نێوان عەرەبی عێراقو کورد, هێشتا بەو ئاسانییە لەبیرناچێتەوە.. ئەگەر بێتو ئەم مەسەلەیەش پشتگوێ بخەین ئەوە بنەماڵەی بارزانی ملۆزممانە, چونکە هەرکاتێك بارودۆخی عێراق تێکچوو, ئەوان هاوکاریی حوکمی نوێ دەکەنو دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ناوچەکەدا دەسەپێنن, بۆچی؟ لەبەرئەوەی مەحاڵە بنەماڵەی بارزانی, لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا رێکبکەوێت, جگەلەوەی ئێمە تەواو لەو باوەڕەداین کەکورد, بەهۆی بنەماڵەی بارزانی یەکناگرنو ئێمە دڵنیاین, هەروەها ئەزموونی چەند ساڵەمان سەلماندی کەبنەماڵەی بارزانی, هەرکە بۆی هەڵکەوێت، جارێکیتر مەرگەساتی ٣١ی ئابی ١٩٩٦, لەگەڵ سوپای دەسەڵاتی نوێی عێراقدا جێبەجێ دەکات, ئیتر ئەو دەسەڵاتە هەرچییەك بێت!

لێرەدا ولائی مەلامستەفا بارزانی بۆ شای ئێران بەبیری بەڕێزت دێنمەوە.. شای ئێران دوای ئەوەی رووخاندیان, مەلامستەفا دەستبەجێ لێی هەڵگەڕایەوەو وەلائی بۆ بەڕێز ئایەتوڵڵا خۆمەینی نواند کاتێك لەئەمریکاوە تەلەفۆنی بۆ کردو ئامادەییی خۆی دەربڕی بۆ قوربانیدان لەپێناو بەرژەوەندیی کۆماری ئیسلامی. جا لەبەرئەوەی گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە, ئەوە جووتە کوڕی بارزانی, مەسعوودو ئدریس, ئەو وەسیەتەیان جێبەجێکردو شار بەشارو شاخ بەشاخ, پێش سوپای کۆماری ئیسلامی کەوتن, سەرقافڵەچیی ئەم خیانەتکارییەش بەڕێز فرەنسۆ حەریری بوو کە لەشاری شنۆ سەرکردایەتیی چەکدارە بارزانییەکانی کرد بۆ داگیرکردنی کوردستانو دایەدەست کۆماری ئیسلامی.

بۆیە بەوپەڕی قایلییەوە دەڵێم: ئایا کورد, لەپرۆسەی گۆڕینی رژێمی بەعس لەعێراق،

یا گۆڕینی سەدام بەفلانیتر, چی دەستدەکەوێت؟ مەگەر سەندنەوەی تۆڵەی ئەوانەی بەعس رۆڵەکانی لەسێدارەدران یا خانوویان رووخێنرا, یا ئەشکەنجەدران یا ئاوارەکران..

سیاسەتی دەوڵەتە عەرەبییەکانو بیروبۆچوونی سەرکردەکانیان (جگە لەسەرۆك قەزافی), بەرهەڵستیکردنی بیری پێکهێنانی قەوارەیەکی کوردییە. سیاسەتی دەوڵەتە ئەوروپییەکانیش بەهەمان شێوەیە, هەموان دژی پێکهێنانی دەوڵەتی کوردین, تەنانەت حزبە کوردییەکانش جاروبار گوێمان لەلێپرسراوێکیان دەبێت کەتەواو دژی دابەشکردنی عێراقو پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردییە.

بەڕێز سەرکۆماری عێراق: ئێستا منو بەڕێزت, لەم بارەماندا لەیەك خاڵدا بەشدارین.. جا لەوەتەی هەرسێ بەرگی کتێبەکەم دەرکردووە, مەترسی لەسەر ژیانمە. ئینجا لەکاتێکدا ئێستاو تۆزێکیتر تیادەچم, کەچی داوای پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی دەکەمو بەشێوەیەك بانگەشەی بۆ دەکەم کەتەواو لەو باوەڕەدام بەئامانج دەگەم. بەڕێزیشت چنگت لەدەسەڵات گیرکردووە هەوڵدەدەیت کۆڵەکەکانی حوکمت قایمتر بکەیت تا نەیارەکانت جەزرەبە بدەیت, لەناکاو ئاژانسی دەنگوباسی عێراق هەواڵێك بڵاودەکاتەوە کە: کاتژمێر ئەوەندەی فلان رۆژ بەڕێزتان وتارێکی گرنگ پێشکەشدەکەن. لەکاتژمێری دیاریکراویشدا, بەڕێزتان رایدەگەیەنن کەحکومەتی عێراق بڕیداوە دان بەتەواوی مافەکانی شیعە لەباشوورو

کورد لەباکووردا بنێت, هەروەها عێراق بۆ سێ حکومەتی هاوبەشو هاوکار لەسایەی سستەمێکی فیدراڵ دابەش بکات: حکومەتی شیعە لەباشوور, حکومەتی سوننە لەناوەڕاستو حکومەتی کوردی لەباکوردا. ئینجا رایدەگەیەنیت کەهێزە سەربازییەکانت, دەمودەست لەکوردستان دەکشێنەوەو دەچنە شاخی حەمرین, هەروەها خاکی کورد لەو عەرەبانە چۆڵ دەکرێت کە لە١٩٥٨/٧/١٤ـەوە بۆ ئەوێ راگوێزراون, بەڵام سوپای عێراقی, کوردستان وا چۆڵ ناکات کەبیداتەدەست حزبە سیاسییە کوردییەکان بەڵکو بۆ ماوەی دوو ساڵ دەدرێتە دەست UN هەتا وادەی هەڵبژاردنێکی ئازاد دێت.. ئەمجارەش کورد فێربووە چۆن نوێنەرەکانی خۆی هەڵبژێرێت. دوای ئەمەش میلیشیاکان چەك دەکرێنو هەرچی ماڵو سامانێك کەبنەماڵەی بارزانی بەتاڵانی بردووە, کە بەزیاتر لەدوو ملیار دۆلار (لەوانەشە من بەکەمترم دانابێت) دەیخەملێنم, لێیان بسەنرێتەوە.

جا ئەم بەیاننامەیە کەئینشائەڵلا دەریدەکەیت, دەبێت هەتا دواسات نهێنی بێت, چونکە جگە لەگەلی عێراق, هیچ دەوڵەتێك لەجیهاندا, لەگەڵ ئەم بیرەدا نییە" جێبەجێکردنی ئەم پرۆژە مەزنەش لەلایەن بەرێزتانەوە ئەم ئەنجامانەی لێدەکەوێتەوە:

١– دوای چارەسەرکردنی کێشەی سەرەکیی ناوخۆی عێراق کەئەویش مەسەلەی شیعەو کوردە, دەوڵەتانی دراوسێو ناوچەکە, هەروەها دوژمنانی خودی صدام حسین بەهانەیان نامێنێت کەببنە مەترسی بۆ سەر حکومەتی نوێی عێراق.

٢– UNو جیهان چیتر بەهانەیان نامێنێت کەصەدام حسەین بەتاوانباری جەنگ بژمێرن, ئینجا بارەکە دەگۆرێتو صەدام دەبێت بەپاڵەوانی ئازادیو بەدیهێنەری ئاشتی.

٣– تۆ (لەدوای سەرۆکی کۆچکردوو جەمال عەبدولناسر), بەهۆی بەدەستهێنانی بڕواو پشتگیریی ٩٩٪ی گەل, دەبیت بەتاکە سەرکردەی ریزی سەرکردەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان کەئەمەش هاوسەنگیی نێوان ئەو سەرکردانە تێکدەدات.

٤– تۆ دەبیتە فاکتەری بەهێز بۆ گۆڕینی نەخشەی ناوچەکە. لەوانەشە CIA بەکرێگیراوێکی لەناوچەکەدا وەك (جەنەراڵەکانی تورکیا) بۆ بەرپاکردنی جەنگ دژی عێراق تەرخان بکات بەڵام هیچیان بۆ ناکرێت, چونکە هیچی وایان بەدەستەوە نییە تا یەك کەس بەرەوابوونی ئەم جەنگەیان قایل بکەن, ئەمە جگە لەوەی ئەوسا دەوڵەتانی دراوسێ, کە لەزەبری عێراق دەترسان, چونکە هێزەکەی لەچەکدابوو, ئەمجارە جگە لەوەی لەبری بەسەربازکردنی چەند سەد هەزار یاخود ملیۆنێك کەس, ئەمجارە گەلی عێراق بە٢١ ملیۆنەکەیەوە دەبن بەسەربازی دڵسۆزو دلێر لەسایەی ئاڵای عێراقی ئازادو سەربەرزدا.

لێرەدا نابێت شیعەی ئێرانو سوریاو لوبنانو جیهان لەبیر بکەین کە بەهەموویانەوە پشتگیریی سەدام حسەینی دۆستی گەل, بەدیهێنەری ئاشتیو پاڵەوانی چاونەترس دەکەن.

٥– کوردو شیعە ئەو نەهامەتییانەیان لەبیردەچێتەوە کە بەسەریانتدا هێناوە، ئنجا وێنەت لەهەموو ماڵێكو بەسنگی هەموو عێراقیو کوردو شیعەیەکدا دەبینرێت لەهەرکوێ بێت.

٦– دەبیت بەیەکەم سەرکردەی خۆشەویست لەهەموو جیهاندا لەلای ئازایخوازو ئاشتیخوازو مرۆڤدۆستان.

ساڵی ١٩٨١ لەلەندەن، بەرنامەی پانۆرامای بەشی عەرەبی ئیزگەی BBC دیدارێکیان لەگەڵمدا سازدا، بێژەرێکیان لێمی پرسی: (ئەگەر سەدام حسەین دان بەمافی کورددا بنێتو داواکانتان بێنێتەدی، هەڵوێستت چی دەبێت؟) گوتم: (دەستبەجێ دەستی ماچ دەکەم).

هەموویان بەم وەڵامە دڵخۆش بوون و چەند وێنەیەکیان بۆم گرت، چونکە بەم وەڵامە بۆم سەلماندن کەئێمە، بۆیە دژایەتیی سەدام دەکەین چونکە ئەو دژایەتیی گەلی کورد دەکات، کاتێکیش ئەو دەبێتە پاڵەوانی ئازادیو ئاشتی، ئیتر پێویست ناکات ئێمە دژایەتیی بکەین، بەڵکو من بەخۆم، بەشانازییەوە بۆ دەستنوێژ، ئاو بەدەستیدا دەکەم.

بەڕێز سەرۆك: بۆ زیاتر روونکردنەوەی هەڵوێستم دەڵێم: ئامانجی بەردەوام پێکهێنانی قەوارەی کوردییە. جا لەدوای دەرکردنی هەرسێ بەرگی کتێبەکەم، نامەم بۆ کۆڵن پاوەڵ، تۆنی بلێر، عەمرۆ مووساو بازاڕی ئەورووپیی هاوبەش نارد، بیرم لەوەکردەوە کەپێش ئەوەی یەکێك لەپیاوەکانت نامەکەت بۆ بێنێت، خۆم بەفاکس یان لەرێگەیەکی ترەوە بینێرم. بۆ زانیاریشت، دوانامە کەناردوومە لە ٢٠٠١/٦/٢٦دا بوو پێش دادگاییکردنی سلۆبۆدان، دوای ئەوە بیرم لەم نامەیە بۆ تۆ کردەوەو دەستمکرد بەنووسینی. هەرگیز بیر لەوەش نەکەیتەوە رستەیەکم بەوە لێکبدەیتەوە گوایە داوای لێبوردن دەکەم، مەسەلەکە بازرگانییە، بەڵام بەشێوەیەکی‌تر، ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندییە (ئازادم بکە، کەسبم دەکەیت)، بەشێتیشم تێنەگەیت کەداوای ئەم شتە گەورەیەت لێدەکەم کەجێبەجێی بکەیت، ئەوەی لەسەر بەڕێزتە ئەوەیە بەوردی بیری لێبکەیتەوەو راستیی مەسەلەکان لەبەرچاو بگریتو نامەکەم بەشێنەیی بخوێنیتەوە، ئنجا بەسەربازێکی نەناسراوم بژمێرە کەهاوار بۆ سەرۆکی دەوڵەتێك دەباتو رێنمایی دەکات لەپێناوخێرو خۆشیی تەواوی نەتەوەیەك، ئەوسا منیش لەرۆژی قیامەتدا لای پەروەردگار پاکانە بۆ خۆم دەکەم‌و دەڵێم: اللهم انی بلغت، الله فاشهد.

تێبینی: زۆر هەوڵمدا ئەم نامەیە دەستاودەست بگاتە لای بەڕێزت بۆ ئەوەی لەموخابەراتی جیهانیی بپارێزم، بەڵام کەسم دەستنەکەوت، ئەمەم بۆ بکات. ناچاربووم لەرێی ئەو ئیمێڵەوە بینێرم کە لەکەناڵی ئاسمانیی عێراقی دەستمکەوت بەو هیوایەی هەتا بەردەستی موخابەراتی جیهان نەکەوتووە، بگاتە دەستی بەڕێزت.

**کۆی گشتی ٢٣لا پەڕە**

**دۆستی هەموو عەرەب و ئازادیخوازێك**
**خزمەتکاری کوردو کوردستان**
**رەفیق پشدەری**

Email:Rawaz-Sadiq.@hotmail.com
**لەویشەوە بۆ رەفیق پشدەری ( ٢٠٠١/٧/١٨ )**

## نامەی دەهەم

### بۆ هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر

بۆ هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەری دانیشتووی هەندەران، ئەوانەی بەتەنگ کەسوکارو هاوزمانەکانیانن لەکوردستانی باشوور، بەتایبەتی بەرێزان:

**د. کەمال میراودەلی**
**د. جەمال نەبەز**
**د. نەجمەدین کەریم**
**پرۆفیسۆر ئەسعەد خەیلانی**
**د. مەحموود عەلی عوسمان**
**مامۆستا جەمال عەلەمدار**

بەرێزان : سەرەتا تکادەکەم خۆشەویستیو رێزی زۆرم قبوولٚ بفەرموون، هیوادارم لەشساغو خۆشحالٚ بنو گیانی کوردایەتیتان هەر لەجۆشوخرۆشدا بێت.

خوشكو برا کوردەکانم لەهەندەران، بەتایبەت ئەو بەڕێزانەی لەسەرەوە ناوم هێناون: من لەڕێی هەرسێ بەرگی کتێبەکەم (کورد دوژمنی خۆت بناسە)، زۆر لایەنی شاراوەو نهێنیی شۆڕشی رزگاریخوازی گەلەکەمانم ئاکشراکردو، گەلەکەمانم لەچەندین راستی ئاگادارکردەوە، بەو هیوایەی بتوانم خزمەتێکی بزاڤی رزگاریخوازی گەلەکەمان بکەمو لەدواجاردا خەباتی نەپساوەمان لەو قەیرانە دەربکەین کەتێی کەوتووە.

بەڕێزان: ئێوە دەزانن کەگەورەترین رێگر لەبەردەم بەئاکام گەیشتنی سەرجەم شۆڕشەکانمان, بوونی دوژمنی ناوخۆیە کەبەردەوام هۆی سەرەکی شکستەکانمانو لەمپەری رێی دروستبوونی دەوڵەتی کوردی بووە هەروەکو لەهەرسێ بەرگی کتێبەکەمدا جەختم لەسەر کردووەو سەلماندوومە کەدوژمنی ناوخۆی هەرەگەورەو نەیاری سەرسەختی شۆڕش، بنەماڵەی بارزانی بووە کەئێستاش لەسەر هەمان سیاسەتی دژە کوردی خۆیان، لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان گاڵتە بەموقەدەراتی گەلەکەمان دەکەن.ئەم بنەماڵەیە وەکو جاڵجاڵۆکە، بەجۆرێك تۆری دەسەڵاتی خۆیان دامەزراندووە مەگەر بەهۆی نەتەوە یەکگرتووەکانو لەڕێی خودی بەڕێز کوفی ئەنانەوە رزگارمان بێت، هەر بۆ هەمان مەبەست لەکتێبەکەمدا نامەیەکم ئاڕاستەی بەڕێزیان کردووە کەپێشتر لەرێی فاکسەوە بەزمانی ئینگلیزی گەیاندمە لای جەنابیان.

بەڕێزان، ئەی ئەو کوردپەروەرانەی لەهەندەرانن‌و ژمارەتان زیاتر لە٢٠٠ هەزار کوردە، ئەی ئەوانەی درێغیتان نەکردووە لەکۆمەککردنی کەسوکارتان لەکوردستانی ئازیزدا، بەتایبەتی ناوبراوانی سەرەوە: ئەمڕۆ بارودۆخی کوردستانی باشوورو رەوتی رووداوەکان، ئەو ئەرکەتان دەخاتە ئەستۆ کەهەریەکەتان لەئاست خۆیەوە کار بۆ سەرخستنی ئەوپێشنیارە بکات کە لەراستیدا داخوازیی سەرجەم گەلی کوردە لەباشوور، کەئەمڕۆ لەترسی کوژرانو دەسەڵاتی بنەماڵە، ناوێرن لەپرۆژەیەکی وادا بەشداری بکەن، ئەگەرنا ئەوە من دڵنیام کەلانی کەم ٩٥٪ی گەلی کورد لەگەڵ ئەو داوایەدایەو هیوا بۆ ئەو رۆژە دەخوازێت کە لەواقیعدا جێبەجێ بێت.

لەکۆتاییدا هیوادارمو داوام ئەوەیە کەهەمووتان لەگەڵ ئێمەدا دەستبەکاربن بۆ ئەم مەبەستە، کەتاکە رێگەی رزگاربوونمانە لەکارەساتەکانی ئەمڕۆو هەڕەشەکانی سبەینێ.

**خزمەتکاری کوردو کوردستان**
**رەفیق پشدەری**

***An open message to the General Secretary***
***Of United Nation Mr. Kofee Annan***

Trading the Kurdish people issue under the Iraqi and the two goverments in the southern Kurdistan under the rule of Mam Jalal and Masu'd.

Mr. Cofee Annan, the general Secretary of United Nations and responsible of peace process and human rights in the world, I would like to express my gratitude as a Kurdish citizen in southern Kurdistan for the efforts you made about the implementation of 986 resolution, that lifted part of the burden on the Iraqi people and made their life better, through implementing various reconstruction projects nowadays and rebuilding the destroyed villages.

*Dear Sir,*
As it is clear the system followed in the countries of the eastern region is based generally on fire and iron, and most of their rules believe in democracy and human rights in their way of dictatorship and totaliterate ruling. I think the most savage and fascist regime is Al-Ba'ath regime in Iraq that subjected Iraqi people generally and Kurdish people especially to the greatest disaster in its history and the history of humanity.

The regime did not get rid of its inhuman policies against its people any time. The destruction of four thousand and five hundred of Kurdish village, bombing Halabja with chemical weapons and tooling processes that killed more than 180 thousand people, all these evidences show how savage this regime was with Kurdish people, this made them to escape toward the mountains of Kurdistan. So they declared their liberation revolution against this aggressive policy. Through this revolution many thousands of people sacrificed themselves, but because many countries of the world and many Arabic countries had supported Iraq, and they had no attitude toward the great crimes committed by the regime against the people, and because of destroying the villages on the border and moving their people to the collective houses, and using mass destruction weapon by Al-Ba'ath regime against our revolution, that is prevented internationally, moreover United nations' Organization and the international Security council that had no point of view toward all these crimes collapsed our organization and it could not fulfil its aims. After the invasion of Kuwait by the Iraqi regime, robbing their properly and exploding their oil wells, neglecting the international public opinion and its resolutions concerning the sovereignty of the country, the real nature of this regime appeared. These countries met under United States administration and they decided to put an end to this regime and return peace to the region. These countries could set Ba'ath regime out of Kuwait.

These events were a golden chance for Kurdish people, they could destroy all Ba'ath institutions in Kurdistan in a mass uprising and they get their liberty which is one of the main rights of all the people of the world, thus the United Nations decided to protect the Kurdish people from Iraqi attacks, their places were prevented from rich areas with oil in southern Kurdistan such as Karkuk, Khanakeen, Shekhan and Tala'far to remain under the administration of ba'ath regime according to this resolution.

As you know Karkuk for Kurds is just like Quds for the Palestinians, but Al-Ba'ath participates freely the policy of arabization, emigration in this region and forcing people to join Al-Ba'ath party. The latest policy this party used was setting the Palestinian refugees in this region which created unsettled situation.

*Dear Sir,*
Our Kurdish people are grateful for they could get this chance to have liberty and to sleep without any fear with their families and they can dream of a better future. This situation is like a happy dream, because it is for the first time to feel that we are not exposed to the attacks of the regional countries.

During this short period we could prove to the world that we want liberty and democracy, therefor a year after the uprising we could have parliament whose members were elected democratically by the rightist and leftist parties very freely, and I can say that it had no parallel in any country of the eastern region.

Unfortunately fighting started between the Kurdish parties and this is because of separation between the Kurdish political powers.

This coasted a great lose for the Kurdish nationalist movement, and the danger of Ba'ath coming back to the region, especially after the events of August 31-1996, when the leader of Kurdistan Democratic Party,Masu'd Al-Barzani, who wined %25 votes and %50 seats of parliament, personally asked for the regime's help.

Thus according to this demand for protecting his party and family the tanks of the republic guards attacked Erbil and they occupied the parliament. This army shooted haphazardly and the people were scared. Thus the Barzani family controlled the financial resources in the richest region in southern Kurdistan. These resources refer to the Kurdish people as a whole without any distinction between their political membership and their beliefs.

They paid no attention to the people's call to get rid of fighting and to solve the problems between them rationally and peacefully.

*Dear sir,*

Most of the people in Kurdistan bear witness that I am not a member in neither of these political parties and I do not defend any of them.

My book " You Kurd recognize your enemy", that is published in Kurdistan in Kurdish language and in the European countries in Arabic language, is a witness.

Through my political expience during fourty years, and my life with the presidents of this country like Abdul Rahman Arif and saddam Hussein, and the Kurdish leaders like Mula Mustafa Al-Barzani, his son Masu'd Al-Barzani, Mam-Jalal and other Kurdish and Arabic leaders who are concerned with the Kurdish people issue, I notified that this family who controlled KDP and used it for their benefit is behind all these disasters and disorder in this region. Thus this family could put about one miliar and 300 000$ in the Turkish and the European banks, while in my meeting with Masu'd Al-Barzani on March 13-1991, he assured that he does not have one dollar in front of some witness.

*Dear Sir,*

This great wealth is Kurdish people's wealth. It refers to the labors and the poor peoples, since there is no legal institutions to rule and control the power of the party leaders, so we are forced to ask you us a responsible of the humanitarian society affairs to find a solution for this great problem that decides the future of this people. This family is about to play with the dreams of forty million of Kurdish people during thousands of years, so if you do not make an effort this family will bring back the regime's tanks to the region once again. Though the revolutionist forces could liberate all the occupied regions by the regime after the treason of August 31 except Erbil, but returning the regimes to Kurdistan with Barzanian family's help is expectable, in case of any political developments. You can solve this problem by putting this liberated region under the protection of United Nations, and setting it free from the control of these Kurdish parties, thus you can spread peace and settlement in the region. As you could distribute food equally in Kurdistan, protecting this people also will be a great service for them.

Some months later it would be possible to start a free and democratic election under your supervision, and then dividing the government institutions on the political parties according to the votes they will gain. At the end I hope you read this letter seriously, through it is from one person but it expresses the needs of all the people of Kurdistan who believe that they can be fulfilled by you.

***Yours***
***Rafik Al-Pishdari***

*Note:*

1-We all know that remaining Saddam in his position is the main reason behind all these disasters in Iraq as a whole.

I am sure that America does not want to remove him now, but on the contrary they always say that " A dictator and a weak person is better than another democratic and active, who does not serve our benefits". This American point of view made the Kurdish people to critics them, because they think that America wants the situation to remain as it is for their benefits. At the same time as Saddam controlled all the Iraqi wealths, the barzanian family also controlled the wealths in Kurdistan and they became a great gang for collecting money.

2-After the uprising of 1991 all the Ba'ath institutions were set out of Kurdistan, but now there are many Iraqi, Iranian, Turkish and other secrete intelligence institutions in Kurdistan, and this is because of lacking of a strong united country.

These institutions implement many destructive and aggressive works against our people, especially when the interior fighting started between the two main parties, PUK and PDK.

3-Karkuk, Khanakeen, tala'far, sngar and Shekhan, that are still under the control of the regime, for being outside the line of 36, are exposed to destruction and emigration. Every day many Kurdish families in Karkuk are transported to the liberated Kurdistan, and they are replaced by Arab people of Iraq and Palestine. The charitable organizations and the responsible local authorities build them houses in regions for from the cities of their ancestors. This is a policy of transporting Kurds and replacing them by Arabs.

4-I sent a letter to the United Nation's representative in Sulaimany on March 1-2000, I published its translation in the last paper of the second part of my book "Your Kurd recognize your enemy", in which I asked for a meeting with United Nation's representative to deal about some private issues and to inform him about some matters, but till now I received no answer. This time I am forced to contact with you directly and I presented a version to your representative in Sulaimany.

***To: Mr. Kofi Annan, UN Secretary General***

***Greetings,***

***It is a great pleasure for me to bring the following issue to your kind attention.***

***The Incident of Explosion for the Fuel station***

***In Shaqlawa 7th December 1995***

*This* incident, which caused killing and injury of more than 22 civilians including two UN staff members, is another ring of the terrorist and criminal scheme against the people by the Barzani family, ordered by regional countries. The target of the operation was the killing of two UN staff members.

*Few* days before the incident, a meeting was held in Salahaddin summer resort, attend by Sudad, the son of Mulla Mustafa Barzani and the so-called Karim Chairman of the terrorist "Parasten Intelligence Organization". The so-called Hussein Hama Soor Agha Mirawdali had aslo been invited for the said meeting in the beginning of the meeting, Sudad Barzani spoke to Hussein Hama Soor saying: "The Iranian Government has helped us in detaining and killing of Hassan Kwestani, and Iran has been and is continuously supporting us and has become a supporter to us, therefore, we should also be cooperative with it (Iran) and pay back the good will. The Iranian Government has requested us to assassinate two Jewish persons working United Nations Organization. That is why we have held this meeting to study the matter jointly and put a plan to carry out this operation.

*In* this manner, Sudad Barzani explained to the loyal man of the family(Hussein Hama Soor Agha), whom has had suspicious relationships with both the Iraqi and Iranian Goverments. The said person showed full readiness to carry out the criminal scheme. During the same meeting, the fuel station near Shaqlawa was identified as a place for committing the crime. The ownership of the fuel station was deported and detained and the station was handed over to another person who is an agent of Parasten Organization. The latter put some TNT explosives inside one of the fuel storage as a preparatory step to carry out the operation. They agreed to implement the plan as following: when the two staff steer to Shaqlawa in their Japanese COROLA car, the Parasten informs Hussein Hama Soor Agha through Radio. When the car of the UN staff arrives in the fuel station, the plan would be implemented. After finishing the operation, Hussein Hama Sooe Agha left the place steering towards Shaqlawa, and asked one of his men called Tashin Khrwatani to stay on the hillside opposite to the fuel station from the eastern side, giving him a remote control set and advised him to be fully ready to monitor the station with binoculars. He was using a radio set to receive orders and guidance from Karim Sinjari about the departure of the car.

*On* 7$^{th}$ December 1995, the day the incident took place, Tashin got information that the car has departed steering towards Shaqlawa, he prepared to commit the crime and when the vehicle arrived, he pressed on the button of the remote set and the fuel station exploded and was on fire. It resulted at killing of two persons and injury of 20 people including the two UN staff members that were working for UNGCI.

*Following* the explosion, the police & security force came to the locating of the incident for investigation. The detained a great number of people at the location, amongst them was one of the men of Hussein Hama Soor called Mahmood, who was participating in committing the crime. After investigation, he collapsed and admitted his participation in the explosion starting: I participated in the process with the order from Hussein Hama Soor, he in

turn, has been ordered by Sudad Barzani and Karim Sinjari to carry out the operation. The news was spread amongst the public. To cover his scandal, Karim was urged to detain all parties involved in the crime and sending them to Akra Jail who were : Hussein Hama Soor Agha, Ali Agha, Mustafa Agha, Farhang Hirani, Omer Gergo and his brothers, Tahsin Khrwatani and Mahmood. During the investigation, it was revealed that Tahsin and killed an Iranian doctor in Harir collective town, who was a member of Kurdistan democratic party- Iran (KPPI). News was spread at that time that this doctor was an agent of Iranian intelligence (Ittaliat). It was revealed that Mahmood is one of the Iranian agents and one of the killers of the said body.

*Thus*, the Barzani family evaded holding the responsibility and imprisoned a great number of people to cover the crime, Since those detained people belong to a powerful tribe, it would not be possible to execute them, while releasing them would threat the security of Barzani family.

*Various* rumors were spread at that time about the parties behind this crime and was said that the crime has been committed with the order of Quasi Saddam Hussein. Regardless that, this crime is another prove on the brutality of this family and their inhuman stance towards those who have come to this country to provide humanitarian services to the people here. It also proves their subordination to the enemies of the Kurdish people.

***Yours,***
***Rafiq Pishdari***
***10th October 2000***

*Remarks:*

***I AM A KURDISH NON-ALIGNED WRITER. I HAVE WRITINGS AND PROCEEDINGS ABOUT THE DICTATOR SADDAM HUSSEIN, SINCE I HAVE LIVED CLOSE TO HIM FOR SOME PERIOD. I HAVE ALSO WRITING ON BARZANI AND HIS FAMILY AS WELL AS ON TALABANI AND ALL KURDISH LEADERSHIPS THAT I HAVE LIVED WITH THEM SINCE 1956 TILL NOW.***

*In* this regard, I have published two volumes of my book: “Kurds, recognize your Enemy”, aiming at revealing the truth. I am writing to relief my conscience, when explaining what has happened to me and what I have seen. It aims at serving my suppressed people. The third volume of my book is about to publish.

*All* these have made people trust in me and respect me and have made them provide me information, trusting me and since I would never turn aside and keen to tell the truth. There is an eyewitness to prove my above- mentioned statement regarding the explosion incidence of Shaqlawa.

*To* be informed that I have been informed that Barzani family and the dictators Saddam Hussein have ordered to assassinate me, and hence I have escaped along with my family to Suleimainyah.

*Regards.*

*CC: UN Representative in Suleimaniyah.*